٨٨



# پاشای دارستان و ڕێویی فێڵباز



وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
بە دەسکارییەوە
جەزا سیاگوێزی




تەلاڵ حەسەن

# پاشای دارستان و ڕێویی فێڵباز



وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بە دەسکارییەوە
جەزا سیاگوێزی

وێنەکێش : هناو مال الله

# پاشای دارستان و ڕێویی فێڵباز

زنجیرەی کتێب : ( 88 )
ناوی کتێب :پاشای دارستان و ڕێویی فێڵباز
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بە دەسکارییەوە
جەزا سیاگوێزی
دیزاین: حەمە هاشم
نیگار کێش:هەنا مالەلا
تایپ: تاڤگە عەلی
هەڵەچن: نیعمەت حەمە عەلی
سەرپەرشتیاری چاپ: عەبدولقادر عەلی مەردان
ژمارەی سپاردن ( 837 )
تیراژ: ( 1000 ) دانە
نرخی : ( 500 ) دینار
2010

لەو کاتەی کە بێچووە سمۆرەکە لەلای لانەکەیەوەبە دەوری دایکیدا دەسوڕایەوە، ڕێووییەکە بە لایاندا تێپەڕی، بێچووە سمۆرەکە چاوی بەڕێو ییەکە کەوت و بە دایکی گووت:
( ئەوە ڕێوییەکەیە ).



سمۆرەی دایکیشی بە سەر سورمانەوە سەیری ڕێوییەکەی کرد و گوتی:
(ئاخۆ دەبێت بۆ کوێ چوو بێت؟)
ڕێوییەکە زۆر سەرقاڵبوو، تەنانەت ئاوڕیشی لە سمۆرەکان نەدایەوە



حاجی لەق لەق دەنووکی بەیەکدا کێشاو بە
رقێکەوە تەماشای ڕێوییەکەی کرد. پاشان
روویکردە کۆتری هاوڕێی کە لە هێلانەکەیدا بە
خەمباری هەڵنیشتبوو، و فرمێسك لە چاوی
دەهاتە خوارێ. حاجی لەق لەق بە دەم خۆیەوە
گووتی ( بەراستی کۆتری هاوڕێم بەستەزمانە،
چونکە ئەو جارێکی تر چاوی بە بێچووەکانی
ناکەوێتەوە ) .لەم کاتەدا حاجی لەق لەق زۆر
ئاواتە خواز بوو، کە بەدەنووکی ڕێوییەکە بۆ
ئاسمان بەرز بکاتەوەو پاشان بەری بداتەوە،
مەرەکان بەدەم باعەباعەکەوە
زەردەخەنەیەکیان کرد، کاتێك چاویان لێبوو
ڕێوییەکە بەرەو بێشەلانەی شێر دەڕۆیشت،
یەکێکیان لەبەر خۆیەوە گووتی:
( ئەمرۆ ڕێوییەکە دەبێتە
ژەمە خۆراکی پاشای دارستان ).







گورگەکە لەبەر دەم بێشەڵانەی شێرەکەدا
وەستابوو بە پڵنگی هاوڕێی گوت:
(تەماشا بکە بزانە کێ بەرەو ئێرە دێت).
پێش ئەوەی پڵنگەکە سەر بەرز بکاتەوە ڕێوییەکە
بەبێ ئەوەی سڵاو بکات، هاواری کردو گوتی:
( دەمەوێت پاشای دارستان ببینم ) پڵنگەکەش
پێکەنی و گوتی :( هەر ئێستا دەیبینیت ).
پاش ئەوەی پڵنگەکە چووە ژوورەوە بۆلای پاشا،
گوورگەکە بە زەردەخەنەیەکەوە بە ڕێوی گوت:
( پاشا ئەم بەیانییە پرسیاری تۆی کرد و پێدەچێت
لەت و پەتت بکات ) . ڕێوییەکە کەتەماشایەکی
گورگەکەی کرد بەڵام هیچی نەوت، پاش کەمێك
پڵنگەکە گەڕایەوەو بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:
(فەرموو ڕێوی پاشا چاوەڕێتە)




رێوییەکە چووە ژوورەوە. پاش ئەوەی
کرنووشی بۆ پاشا برد، گوتی : گەورەم
ئەم کاتەت باش
پاشا من وای بۆ دەچووم کە ئەمڕۆ تۆ
نەیەیتە لام، ئەوە بۆ دواکەوتییت، لەکوێ
بوویت؟

ڕێوی : ببورە گەورەم، پاشای
دارستانی مەیموونان ناردبووی
بە دوامدا بۆیە دواکەوتم.
پاشا: تۆوی بۆ چییە، دیارە
دەیەوێت بتکاتە هاوسەری
کچەکەی ؟
ڕێوی: نەخێر گەورەم، بەڵکو
ئەو دەیویست کە کەوایەکی لە
فەرووی بۆ بدوورم.
پاشا: بەسەر سورمانەوە، من
یەکەم جارە ببیستم کە تۆ
بەرك دروویت و دەتوانیت
کەوای فەروو بدووریت!
ڕێوی: گەورەم خەتای منە کە
پێم نەوتویت چونکە من زۆر
باسی خۆم ناکەم.



پاشا: باشه، پاشای دارستانی مه یموونان کەوای فەرووی بۆ چییه دیاره ئەو عەبایەی بە خۆیدا دەدات بە کەڵکی نایەت؟
ڕێوی: گەورەم ئەو نەخۆش کەوتووه، چونکه وەکو تۆ لەبەر هەوادا دەخەوت و ئێستا ئاوهەوا زۆر ساردەو پێویسته تۆش ئاگات له خۆت بێت.
پاشا: بێدەنگ بە.من وەکو پاشای دارستانی مه یموونان پیر نەبووم.
ڕێوی: ڕاسته گەورەم، بەڵام زۆر شێری گەنج هەبوون، که نەخۆشی هیلاکی کردن سەرما زیان بە هەموومان دەگەیەنێت.
پاشا: کەوای سەرشانی فڕێداو گوتی: نەفام ، دەڵێی من بە پیر دەزانی، کەوای فەروو بەس زستانان بە کەڵك دێت.
پاشا سەرنجی ڕێوییەکەی داو گوتی: پێم ناڵێیت له چ شتێك کەوای فەروو دروست دەکەیت؟!
ڕێوی بە دڵخۆشییەوە: گەورەم، مەبەستت کەوای زۆر چاکه.
پاشا: ئا ئا.
ڕێوی: گەورەم له پێستی بەرخ.
پاشا: کەوایەکی فەروو چەند پێستی بەرخی پێویسته؟
ڕێوی: کەوای باشت مەبەسته؟
پاشا: ئا.. هی باش.







ڕێوی: پێنج یان شەش پێستی دەوێت.

پاشا: باشە سبەینێ شەش پێستت بۆ دەنێرم.

ڕێوی :گەورەم پێستەکان مەنێرە.



پاشا : ئەی چیت بۆ بنێرم؟
ڕێوی: گەورەم بەرخەکانم بە دوای یەکدا بۆ بنێرە، کەوای فەرووی باش، پێویستی بە کەسێکی شارەزا هەیە تا بە باشی پێستی بەرخەکان بگروێنێت.
پاشا : باشە شەش بەرخت بۆ دەنێرم.
ڕێوی: نا گەورەم وا باشە ڕۆژی تەنها یەك بەرخم بۆ بنێریت، ئەویش بەیانیان زوو چونکە بەیانیان زوو زۆر خۆشە، مەبەستم ئیش کردن لە بەیانیاندا زۆر خۆشە، دڵنیاشبە گەورەم منداڵەکانم و خێزانم ئەم کارەیان زۆر بەلاوە خۆش دەبێت، ئێستاش من بەخوات دەسپێرم، هیوادارم هەردەم لەش ساغ بیت.



پاشان ڕێوییەکە کرنووشی بۆ پاشا برد و بۆ ماڵەکەی خۆی گەڕایەوە.
پاشاش پێکەنی و لەبەردەم خۆیەوە گوتی: بەهۆی هاوکاری ڕێوییەکەوە ئەم زستانەم زۆر گەرم وخۆش دەبێت، کێ باوەری دەکرد کە ڕێوی بەرگ درووبێت!!. بۆ ڕۆژی دوایی پڵنگەکە بەرخێکی هەڵگرت و ویستی بەرەو ماڵی ڕێوییەکە بکەوێتە ڕێ.
گورگەکە بە پڵنگی هاوڕێی گوت: ئایا تۆ لەو بڕوایەدایت کە ڕێوی کەوای فەروو بدروێت؟
پڵنگەکە: بەلێ، کێ دەتوانێت لەگەڵ پاشادا درۆ بکات.



بێچووە سمۆرەکە لە دایکی پرسی: دایکە کەوای فەروو چییە؟
دایکەسمۆرە: ئەوەیە کە تۆ لەبەرتدایە.
بێچووە سمۆرە: من تەنها فەرووی خۆمم لەبەردایە، کە بە تووک دا پۆشراوە.
دایکە سمۆرە: فەرووی ئێمە بەمشێوەیەیە، ئیتر بێدەنگ بە، نەوەك پاشا گوێی لە قسەکانمان بێت و بەرێوی بڵێت کە لە فەرووی ئێمە کەوای بۆ دروست بکات.
پاشان بێچووە سمۆرەکە ترسی لێنیشت و لە نێوان خوشك و براکانیدا خۆی شاردەوە.



حاجی لەق لەق بەکۆتری گوت: من باوەڕ بە قسەی کەس ناکەم، چونکە من گومانم هەیە ڕێوی بەرگدروو بێت و کەوای فەروو بدروێت!!
کۆتر گوتی: ڕێوی فێڵباز دوو بێچووەکەی منی خوارد ،بەڵام باوەڕ ناکەم کە بوێرێت گاڵتە بە پاشا بکات!
حاجی لەق لەق: ئەو برسییە ،هەرچی لە دەست بێت دریغی ناکات.
مەڕەکان زۆر دڵتەنگ بوون و نەیان دەزانی چی بکەن، چونکە ئەوە شەشەم بەرخیان بوو کە پڵنگەکە بۆ ڕێوییەکەی ببات، پاشان یەکێکیان پێییەکانی بە زەویدادا و لەبەر خۆیەوە گوتی:
ئاخ خۆزگە رۆژێك ڕێوییەکە دەکەوێتە بەر دەستم دەبێ سکی هەڵدڕم.



بۆ رۆژی حەوتەم پاشا پڵنگی بانگ کردو پێی راگەیاند کە بچێت بۆماڵی رێوی و لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت بۆ لای پاشا. بەلام رێوی ئامادە نەبوو کە بچێت بۆ لای پاشا و بە پڵنگی گوت: بە پاشا بڵێ من ئێستا زۆر سەرقاڵم، بەلام ئەمرۆ هەر سەری لێدەدەم. ئێوارە رێوییەکە چوو بۆ لای پاشا.

پاشاش زۆر تووڕە بوو، نەڕاندی و گوتی: ئەی رێوییەی نەفرەت لێکراو کاتێك پڵنگم نارد بە دواتدا بۆ نەهاتی بۆلام؟

رێویەکە کڕنووشی بۆ پاشا بردو گوتی: گەورەم من بۆیە نەهاتم چونکە نەمویست دەست لە دوورینی کەوا فەرووەکە هەڵبگرم، خۆت دەزانیت زستان نزیك بۆتەوە و هەفتەی ئایندە لەوانەیە بەفر ببارێت!!

پاشا کوا کەوا فەرووەکەم؟

رێوی: تەنها بەشی خوارەوەی ماوە

پاشا: تەواو بوونی چەند رۆژی دەوێت؟

رێوی: گەورەم بپرسە چەند بەرخی تری دەوێت؟

پاشا: من شەش بەرخم بۆ ناردی، هەرچەند تۆ گوتت کە پێنج بەرخ بەش دەکات!



ڕێوی: گەورەم من لە بیرم چوو کە جەنابت گەنج و ئازا و گەورەیت، چونکە کەوا فەروەکەی پاشای دارستانی مەیموونان تەنها چوار بەرخ و نیوی تێچووە.



پاشا : بۆچی خۆ ئەویش وەکو من هەر شێرە؟
ڕێوی: بەڵێ گەورەم ڕاستە شێرە بەڵام ئەو زۆر پیرو لاوازە؟
پاشا بەم قسانە رووی گەش بوو پاشان گوتی : چەند بەرخی تری دەوێت؟
ڕێوی: دوو بەرخی تر بەش دەکات بەڵام ئەگەر دوان و نیوم بۆ بنێریت باشترە.
پاشا : نا بەڵکو سیانی ترت بۆ دەنێرم.
ڕێوی: چۆنی بەباش دەزانیت با وابێت بەڵام من ئاواتە خوازم کە بەرخەکانم لەبەرە بەیاندا بۆ بنێریت و ئەگەر دەکرێت با قەڵەوبن، گەورەم خێزان و منداڵەکانم زۆر پەرۆشن بۆ تەواوکردنی کەوا فەروەکەی جەنابت، پاشان ڕێوییەکە کاتێك کرنووشی بۆ پاشا بردو گوتی: بەخوات دەسپێرم گەورەم ، پاشان بە خێرایی بەرەو ماڵەکەی گەرایەوە بۆ رۆژی دوایی بێچووە سمۆرەکە لە پەنجەرەی ماڵەکەیانەوە چاوی لە پڵنگەکە بوو، بەرخێکی قەڵەوی جوانی دەبرد بۆ ماڵی ڕێوییەکە، بۆیە بانگی دایکی کردو دایکە سمۆرەش چاوی هەڵبڕی و گوتی: هێشتا رۆژ نەبۆتەوە چەند ڕێوییەکی فێڵبازە؟ ـ پاشان بە بێچووەکەی گوت: بگەڕێوە بۆ جێگەی نووستنت،



بێچووە سمۆرەکەش بەدڵ تەنگییەوە گوتی: ئەمە بەرخی حەوتەم بوو!!
دایکە سمۆرەش تەماشای بەرخەکەی کردو گوتی: دەبێت دایکی ئەو بەرخە چەند بەستەزمان بێت، ئەگەر من لە جێگەی ئەو بوومایە تا مردن شەرم دەکرد، لە باتی ئەوەی کە بێچووەکەم پێشکەشی پاشا بکەم، تا پێستەکەی بگروێت و بیکاتە کەوای فەروو، من زۆر دڵخۆشم، کەوا خوا بە سمۆرە دروستی کردووم.



کۆترەکە بەساردییەوە تەماشای بەرخەکەی کردو گوتی: ئەوە بەرخی حەوتەمە!!حاجی لەق لەقیش گوتی: رۆژێك دادێت رێوی بە سزای خۆی بگات.کۆتر: من هەرگیز ئەو دوو بێچووەم لە بیر ناچێت کە رێوییەکە خواردنی حاجی لەق لەق: خۆزگە رێوی دەکەوێتە بەردەستم و بۆ ئاسمان بەرزی بکەمەوە و پاشان بیدەم بە زەویدا. پاشا بانگی پڵنگی کرد داوای لێکرد کە بچێت بۆماڵی رێوییەکە بۆ ئەوەی فەرووەکەی بۆ بهێنێت. پڵنگەکەش چوو بۆ ماڵی رێوییەکەو لە دەرگایدا، بەلام کەس دەرگای لێنەکردەوە، دووبارەو سێ بارەو چوار بارە لە دەرگای دایەوە، بەلام کەس وەلامی نەدایەوە پاشان پڵنگەکە پاڵی بە دەرگاکەوە ناو گوتی: رێوی تۆ لە کوێیت؟ وادیارە ئەو نەفرەت لێکراوە رای کردووە!! پاشان بەخێرایی گەرایەوە بۆ لای پاشاو پێی گوت:رێوییەکە ماڵی چۆڵ کردووە و خۆی شاردۆتەوە، لە ماڵە کەیدا تەنها ئێسك و پروسکی بەرخەکانی لێیە. پاشا نەراندی و گوتی:دیارە ئەو نەفرەت لێکراوە هەڵی خەڵەتاندوم ،بەڵام هەرگیز لە دەستی پاشا قوتاری نابێت. پاشان گوتی: ئەی پڵنگ پێنج لە گورگە گە نجەکان لەگەڵ خۆتدا بەرەو تا ئێوارە رێوییەکەم بۆ بدۆزنەوە.

پڵنگەکەش کڕنۆشی بۆپاشا بردو گوتی: بەسەر چاو گەورەم.



پێش ئەوەی ئێوارە دابێت پڵنگەکە و پێنج گورگەکە گەڕانەوە، ڕێوییەکە و خێزانەکەی و بێچووەکانیشیان لەگەڵدا بوو، دواتر بردیاننە بەردەمی پاشا کە هەموو گیاندارەکانی دارستانەکەی لە دەوری کۆببوویەوە،

پاشا بە تووڕەییەوە بەڕێوییەکەی گوت: کوا فەرووەکە؟

ڕێوی چووە بەردەمی پاشاو بە ترسەوە گوتی: بڕوا بکە گەورەم کەوا فەروەکەم بۆ تۆ دووری، بەڵام منداڵەکانم لە برسانا خواردیان. پاشا: تۆ ناتوانیت بۆ دووەم جار هەڵم بخەڵەتێنیت!.

ڕێوی: گەورەم ڕێگەم پێبدە با دیسان بۆت بدوورمەوە،

پاشاش گوێی لە ڕێویەکە نەگرت و گوتی: حاجی لەق لەق لە کوێیە؟

ڕێوی: گەورەم حاجی لەق لەق بەرگ دروویەکی باش نییە.

پاشا: ئەم جارەیان لە پێستی تۆ کەوا دروست دەکەم.

ڕێوی هاواری کردو گوتی: گەورەم ئەم جارەیان لێم ببورە.

پاشا: حاجی لەق لەق هاتە بەردەمی پاشا و کڕنووشی بۆ بردو گوتی: گەورەم فەرمانت بە چییە؟

پاشا: بیستوومە کە تۆ دەتوانیت بۆ ئاسمان زۆر بەرز بیتەوە

حاجی لەق لەق : دەتوانم ئەوەندە بەرز ببمەوە کە لە بەرچاومدا زەوی وەکو کولێرەیەکی خڕی لی بێت .



پاشا: زۆر چاکە ئەم ڕێوییە زۆر برسیەتی زۆر بەرزی بکەرەوە.
پاشان ئەو کولێرە خڕەی پیشان بدە.
ڕێوییەکە خۆی خستە سەر دەستی پاشا و دەستی بە گریان کردو
گوتی: گەورەم ئەم جارەیان لەبەر خاتری خێزان و منداڵەکانم
لێم ببورە.





پاشا: حاجی لەق لەق، دەی بەرەو ئاسمان بەرزی بکەرەوە.
حاجی لەق لەق بە دەنووکی ڕێوییەکەی هەڵگرت و بۆ ئاسمان بەرزی کردەوە، پاشان لە ڕێوییەکەی پرسی: زەویت لێ دیارە؟
ڕێوییەکەش بە ترسەوە گوتی: بەڵێ.
حاجی لەق لەق : زەوی لە چی دەچێت؟
ڕێوی :لە سینییەکی گەورە.
حاجی لەق لەق : کەواتە هێشتا ماومانە. پاشان زۆر زیاتر بەرز بووەوە بۆ جاری سێیەم پرسیەوە: ئێستا زەویت لێ دیارە؟
ڕێوی: بەڵێ.
حاجی لەق لەق: زەوی لە چی دەچێت؟
ڕێوی: لە پارچە کولێرەیەکی خر.
حاجی لەق لەق: کەواتە گەیشتووین ،
ڕێوییەکە کەوتە پاڕانەوەو هات و هاوار.





حاجی لەق لەق: دەڵێی زۆر برسییتە؟
ڕێوی: تکایە بەزەیت پێمدا بێتەوە.
حاجی لەق لەق: ئەی برسیت نییە؟
ڕێوی: خەریکە دەمرم لە برسا.
حاجی لەق لەق: باشە ئەو کولێرە خرەت بەدڵە؟
ڕێوی : ئەگەر گۆشت هەبوایە ئەوا باش بوو ،بەڵام پیاو کە برسی بوو هەموو شتێك دەخوات!.
حاجی لەق لەق: باشە دەبڕۆ ئەو کولێرە خڕە بخۆ.
ڕێوی: نا تکایە بەرم مەدەرەوە.







حاجی لەق لەق: بە داخەوە ئەو کولێرە خرە هیچ گۆشتی تێدا نییە، چونکە لەبەرد دروست کراوە، برۆ دەی خوات لەگەڵ ڕێوی. پاشان حاجی لەق لەق دەنووکی کردەوە، ڕێوی کەوتە پەلەقاژە و گوتی: ئای... کولێرە خرەکە گەورە بوو، ئای...بووە سینییەکی بچووك. ئای بوو بە سینیەکی گەورە. ئای ....سینییەکە گەورە بوو، گەورە بوو ئای...خۆ ئەوە زەوییە. ئێستا هەموو گیانم تێك و پێك دەشکێت.!!

چیرۆکێکی بەسوودە ، باسی چارەنووسی ستەمکار دەکات ، ئەم چیرۆکە وا لە منداڵ دەکات بەزەیی بە گیانلەبەرە بەستەزمانەکاندا بێتەوە ، وەك سمۆرە و کۆتر . هەروەها بەرگرییان لێبکات و بیانپارێزێت.

